


# جیهانی پڕ نهێنیی گیانداران - ١

## دراوسێ جەمسەرییەکەمان

## پەنگوین

ئامادەکردنی: پرۆفیسۆر عارف سارسڵماز
وەرگێڕانی: دەستەی وەرگێڕانی دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
چاپی یەکەم: تەمووز - ٢٠١٣ تیراژ: ٢٠٠٠
چاپی دووەم: تشرینی دووەم - ٢٠١٣ تیراژ: ٣٠٠٠
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٧٥)ی ساڵی (٢٠١٣)ی پێدراوە

شوێنی چاپ
Neşe
Neşe Matbaacılık - İstanbul - TURKEY
+90 212 886 83 30
www.nesematbaacilik.com



دەزگای چاپ و پەخشی کانی عیرفان
www.irfanpublishing.com

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر
+964 (0) 713 80 00

# ناوەرۆك







## سڵاو هاوڕێیان!

ئایا قەت بینیوتانە گیاندارێک فەرووی لەبەردابێ؟ دە ئەوەتا ببینن، من
بە خۆم و فەرووەکەی بەرمەوە! خاوەنەکەم ئەم فەرووەی بۆ نەکڕیوم. ئاخر
هاوڕێیان خۆ من گیاندارێکی ماڵی نیم! هەروەها پارەشم پێ نەداوە. بەڵکو
هەر لەو ڕۆژەوەی هاتووومەتە دنیاوە، بەوێنەی دایک و باوک و هاوڕێکانم،
منیش ئەم پۆشاکەم لەبەردایە. هەر بۆیە لە بەرامبەر ئەم دیارییە جوانەدا
سوپاسی بێپایانی بەدیهێنەرەکەم دەکەم. ئایا ئێستا زانیتان کێم؟ ئافەرین،
من پەنگوینم. ئەها دانیشتووە خۆشەویستەکەی ناوچە بەستەڵەکەکان!
ئامادەن پێکەوە گەشتێک بکەین و چەندین زانیاری دەربارەی من و
هاوڕێکانە فێربن؟ دە کەواتە با دەست پێ بکەین...

# دانیشتووە خۆشەویستەکەی بەستەڵەکەکان

خۆ بەستەڵەکەکان دەزانن! مەبەستم لە جەمسەری باکوور و باشووری گۆی زەوییە. ئەو ناوچانەی شەش مانگ ڕۆژ و شەش مانگیش شەون. ئێوە پێمان دەڵێن دانیشتووە ڕۆح سووکەکەی بەستەڵەکەکان. بەڵام من تەنها لە بەستەڵەکی باشوور دەژیم. هەروەها دەتوانن لە کەناراوەکانی ئوستورالیا و نیوزلەندا و ئەمریکای باشوور و ئەفریقای باشووریش بمانبینن. دەشڵێن جگە لە من گیاندارێکی تریش بە ناوی ورچی بەستەڵەکەوە لە جەمسەرەکان دەژی. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ من تا ئێستا چاوم بە جەنابیان نەکەوتووە، چونکە بەڕێزیان تەنها لە جەمسەری باکوور دەژین.




کەستان تێدایە پەنگوینی دیبێ؟ من تا
ئێستا نەمدیوە. وەک بیستوومە دەڵێن
لە جەمسەری باشوور دەژی!



## زۆۆۆر سسسارده!

جەمسەرەکان ساردترین شوێنی دنیان، ئینجا وەرە زستانیشی بچێتە سەر! بۆیە وەرزی زستان بۆ گیانداران زۆر سەخت و گرانە. زەریا و دەریاکان دەیبەستن و دەبنە پارچەیەک سەهۆڵ. گەردەلوول و زریانە بەفرییەکان هەموو لایەک دەگرنەوە. جا ئیتر ئێمەی پەنگوین ناچارین لە سەرمایەکی ئاوەهادا ژیان بەسەربەرین. فەرووەکەی بەرمان کە بە مووی چڕوپڕ و چەور داپۆشراوە، لەگەڵ چینە چەورییەکەی ژێر پێستمان، دوو هۆکاری زۆر گرنگن بۆ پاراستنمان لە سەرما. بچووکیی قاچەکانیشمان خۆی لە خۆیدا سوودێکی ترمان پێدەگەیەنێت.

زۆربەی کات پلەی گەرما لە جەمسەرەکاندا بۆ ژێر چل پلەی سەدی یاخود نزمتریش دادەبەزێت. تێکڕای پلەی گەرمی لەشی ئێمەش ٤٠ پلەی سەدییە. هەر بۆیە گەرمای دەرەوە لەگەڵ پلەی گەرمی لەشماندا زیاد لە ٨٠ پلە جیاوازی هەیە. جا بۆ ئەوەی ئەم جیاوازییە زیانمان پێ نەگەیەنێت و پلەی گەرمی لەشمان پارێزراو بێت، لەشمان بە شێوەیەکی تایبەتی دروست کراوە.





# هەنگاوە وردیلەکان

لەبەر بچووکیی قاچەکانمان، لە هەر هەنگاوێکدا تەنها ١٠ سم دەتوانین ڕێ ببڕین. واتە ئەو دوورییەی ئێوە بە یەک هەنگاو دەیبڕن، ئێمە بە شەش هەنگاو دەیبڕین. ئەو لەنجەولارەشی لە کاتی ڕۆیشتندا دەیکەین، درێژی هەنگاوەکانمان چەند سانتیمێک زیاد دەکات. لەنجەولارەکەشمان هەر بۆ ئەم مەبەستەیە. لە ڕاستیدا ئەم جوولە بەندۆڵ ئاسایەمان بۆ پاشەکەوت کردنی وزەیە. لەدوای هەر هەنگاوێک، لە ماسولکەکانماندا وزە بۆ هەنگاوی دواتر کۆدەبێتەوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ماندوو نەبین. دەتوانین لە خولەکێکدا ١٢٠ هەنگاو بنێین و لە وشکانیشدا بە خێرایی ١-٢ کم لە سەعاتێکدا بجوولێین.



# شێوازێکی جیاوازی خلیسکێنە

هاوڕێیان لێتان ناشارمەوە کە ئێمەی پەنگوین ناتوانین لە وشکانیدا بەخێرایی بجووڵێین. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە نەتوانین لەسەر سەهۆڵ مەودایەکی دوور ببڕین. بۆ ئەوەی هێلکەکانمان دابنێین، جاری وا هەیە پێویست دەکات سەد کیلۆمەتر لە دەریاوە دوور بکەوینەوە. بێگومان لەم بارەشدا ڕێگای گەڕانەوەمان تا بڵێی دوور و درێژ دەبێت. ئەمە جگە لەوەی کە زۆر برسیشمان دەبێت. بۆیە دەبێت پەلە بکەم لە گەڕانەوەم بۆ دەریا. کەواتە چار چییە؟ لە هەلومەرجێکی لەو جۆرەدا منیش خۆم دەخلیسکێنم. چی؟! خۆت دەخلیسکێنی؟ بەڵێ ئازیزان، لەسەر سک پاڵدەکەوم و وەک تەختەی خلیسکێنە خۆم دەخلیسکێنم. بەم شێوەیە دەتوانم مەودا دوور و درێژەکان بە کاتێکی کەم ببڕم.





# دەتوانم بەرگەی برسێتی بگرم

ئێوەی مرۆڤ لەوانەیە بەرگەی چەند ڕۆژێک برسێتی بگرن. بەڵام من دەتوانم بۆ ماوەی چوار مانگی ڕەبەق بەبێ خواردن بژیم. لەو ماوەیەدا نیوەی کێشی لەشم لەدەست دەدەم. خۆ ئەگەر تەنها بیر لە خۆم بکەمەوە و بێچووەکەم یاخود هێلکەکەم بەتەنیا جێبهێڵم، ئەوا لەوانەیە ببمە هۆکاری مردنیان. ژیان لەسەر بنەمای خۆبەخشی بنیات نراوە نەک خۆپەرستی.



# ئەگەر بمتوانیایە بفڕم

ئازیزان، بە شێوەیەک بەدی نەهێنراوم بتوانم وەک باڵندە بە هەوادا بفڕم، بەڵکو بە شێوەیەک دروستکراوم کە بتوانم لە ئاودا مەلە بکەم. ئەو لێکچوونەی لەنێوان باڵی من و باڵی باڵندەکاندا هەیە، ئەوە ناگەیەنێت منیش پێشتر وەک ئەوان باڵدار بوومە و توانیومە بفڕم. خۆ ئەگەر توانای فڕینم هەبوایە، ئەوا هەر بەردەوام دەبووم لەسەری. کێ هەیە واز لە تایبەتمەندییەکی وەک فڕین بهێنێت؟! ئەگەر بمتوانیایە بفڕم، چیم دابوو لەم سەرمایە؟ بۆ خۆم لە ناوچە گەرمەسێرەکان لەگەڵ باڵندەکانی تردا دەژیام. باڵەکانی پێشەوەم ئەوەندە جوان و بەجێ بەدیهێنراون، هەر دەڵێی سەوڵی بەلەمن. هەر لەبەر ئەمەشە کە هیچ باڵندەیەک ناتوانێت وەکو من بەباشی مەلە بکات.



# پێکهاتەیەکی نائاوازە

مووە ڕەق و ڕێکەکانی کلکم ڕۆڵی سوکان دەبینن. لەبەر ئەوە لە کاتی ڕاوەماسیدا دەتوانم بەئاسانی پێچاوپێچ بکەم. ئەمە جگە لەوەی لەدواوە یارمەتیم دەدەن بۆ ئەوەی قنج و قیت لەسەر سەهۆڵە خلیسکەکان ڕابوەستم. لەشیشم لەسەر شێوەی ژێردەریایی دروستکراوە، کە گونجاوترین شێوەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی پەستانی ژێر ئاو. بەهۆی ئەم پێکهاتەیەی جەستەمەوە ڕووبەڕووی کەمترین بەرەنگاری دەبمەوە لەژێر ئاودا. ئەمەش وا دەکات بەئاسانی لەناو ئاودا مەلە بکەم. لە سایەی ئەم تایبەتمەندییەمانەوە دەتوانین (٦٠٠) مەتر بچینە قوڵاییەوە و (١٠-١٥) خولەکیش لەژێر ئاودا بمێنینەوە.



## چۆن ڕاو دەکەم؟

ئایا دەزانن من دەنووکم بەکار دەهێنم بۆ پەیداکردنی خۆراک؟ لەڕێی دەنووکە بەهێزەکەمەوە ماسییە لووسەکان دەگرم و ناهێڵم لەدەستم دەربچن. هەروەها بچووکیی دەنووکم ناهێڵێت گەرمی لەشم لەدەست بدەم و ڕەق ببمەوە. ئەمەش خۆی لە خۆیدا موعجیزەیەکی ترە.



# پێکهاتەی سەرسووڕهێنی لووتم

هاوڕێیان، بە دڵنیاییەوە سەرنجی ئەوەتان داوە کاتێک لە وەرزی زستاندا هەناسە دەدەنەوە، هەناسەکەتان دەبێت بە هەڵم. هۆکاری ئەمەش چڕ بوونەوەی هەڵمی ناو هەناسەکەتانە کە لە هەوای دەرەوە گەرمترە. لەگەڵ هەر هەناسە دانەوەیەکتاندا کەمێک لە گەرمی لەشتان لەدەست دەدەن. خۆ ئەگەر پێکهاتەی لووتمان وەکو هی ئێوە بوایە، ئەوا لە ڕۆژە ساردەکانی زستاندا لە ماوەیەکی کەمدا ڕەق دەبووینەوە. جیاواز لە لووتی ئێوە، لووتی من بەشێوەیەکی درێژکۆلەی پێچاوپێچی ناوبۆش دروستکراوە. سوودی ئەم پێچاوپێچە ناوبۆشانە ئەوەیە کاتێک هەوا بەناو بۆشاییەکانی لووتمدا هاتوچۆ دەکات، گەرمییەکەی ناوی دەگەڕێتەوە بۆ دەمارەکانی خوێنم و بە ساردی دێتە دەرەوە. ئیتر بەم شێوەیە گەرمی لەشم پارێزراو دەبێت.



## ڕەش و سپی پێکەوە، هەم گەرمی بەخش و هەم بزرکەر

مووەکانی سەرپشتم ڕەشن، ئەوانەی سەر سکیشم سپی. وەک دەزانن ڕەنگی ڕەش تیشکی خۆر هەڵدەمژێت. بۆیە مووە ڕەشەکانی پشتم گەرمی لەشم دابین دەکەن. مووە سپیەکانی پێشەوەشم لە سەرزەمینی سپی و بەفراوی و بەستەڵەک، دەبنە هۆی ئەوەی دوژمنەکانم بەئاسانی نەمناسنەوە. کاتێک هەست بە نزیکبوونەوەی مەترسییەک دەکەم، ڕووی خۆم وەردەگێڕمە ئەو لایە و، هاوشێوەی جلوبەرگی سەربازی، منیش تا ڕادەیەک خۆم لە بەرچاو بزر دەکەم. لە قووڵایی دەریاشدا کاتێک لە نێچیرێک نزیک دەبمەوە، بەهۆی ئەوەی بەشی پێشەوەی لەشم سپییە، نێچیرەکەم تا ماوەیەک هەستم پێ ناکات.



# هێز لە یەکگرتندایە

لە دنیای گیانداراندا ئێمەی پەنگوین بە یەکێک لە کۆمەڵایەتیترین گیاندارەکان ناسراوین. حەزمان لە ژیانی تەنیایی نییە. جا خۆ بە تەنها ناتوانین بەرگەی ساردی و سەختی زستان بگرین. بۆیە بە مەبەستی خۆپارێزی لە سەرما و سۆڵەی زستان، هەموومان لە جێیەکدا کۆدەبینەوە و دەچین بەناو یەکدا. بەم جۆرە سوود لە گەرمیی یەکتری وەردەگرین و گەرمیی لەشمان دەپارێزین. جاری وا هەیە ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەیەک دەگاتە چەندین هەزار. ئەوەش بزانن کە ئەمە کۆبوونەوەیەکی خۆپەرستانە نییە. لاواز و بێهێزەکان لە ناوەڕاستی کۆمەڵەکەدا دادەنێین، ئەوانەشی گەورە و بەهێزترن لە بازنەکانی دەرەوەدا دەوەستن.


گرنگیی ئێشکگرتن
ئەو هاوڕێیانەمان کەوا لە بازنەکانی دەرەوەدان، بە بەراورد بەوانەی لە ناوەوەن، زیاتر ڕووبەڕووی سەرما دەبنەوە و مەترسی ڕەقبوونەوەیان زۆرترە. جا بۆ ئەوەی شتی وا ڕوو نەدات، ئێشک دەگرین و بەنۆبە شوێنەکانمان دەگۆڕینەوە. واتە، ئەوانەی لە بازنەکانی دەرەوەدا وەستاون، کاتێک سەرما زۆریان بۆ دێنێت، جێگاکانیان لەگەڵ ئەوانەی لە بازنەکانی ناوەوەدان ئاڵوگۆڕ دەکەن. لە سایەی ئەم قوربانیدان و پشت بەیەک بەستنەدا، ڕێژەی لەدەستدانی گەرمی کۆمەڵەکەمان بۆ ٪۵۰ کەم دەبێتەوە.



# دەبێت زۆر هەوڵ بدەم!

وەک هەموو زیندەوەرانی تر، منیش پێویستم بە خۆراکە بۆ ئەوەی بژیم. خۆراکی منیش لەناو دەریادایە. جا لەبەر ئەوەی لە سەرمادا پێویستم بە وزەی زیاتر هەیە، بۆیە ناچارم زۆرینەی ژەمە خۆراکییەکانم لە بەرهەمە ئاوییەکانی وەک ڕۆبیان و ماسییە چەورەکانەوە دەست بخەم. هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژم و دەچمە ژێر ئاوەوە. پێویستە پێش تەواوبوونی هەوای ناو سییەکانم، نێچیرەکەم ڕاو بکەم. کلک و باڵەکانم کارئاسانی زۆرم بۆ دەکەن لەکاتی ڕاودا. خۆ ئەگەر هەستیشم کرد یەکێک دەیەوێت زیانم پێ بگەیەنێت، ئەوا کارێک دەکەم هەر نەشزانێت بۆ کوێ چووم. گوڕێکی بۆ دەخۆمەوە و بە بەرزی دوو مەتر باز دەدەمە سەر وشکانی یان شەختەسەهۆڵێک.



# دایکایەتی و باوکایەتی ئەرکێکی گرانە

هەندێک جۆرمان لە ساڵێکدا یەک جار، هەندێکی تریشمان لە ساڵێکدا دوو تا سێ جار هێلکە دەکەین. بەم شێوەیەش بەردەوامی بە وەچەکانمان دەدەین. کاتی هێلکەکردنیشمان هاوکاتە لەگەڵ زستاندا. خۆ ئەگەر بێتو لە زستانی ساردی بەستەڵەکدا هێلکەکانمان گەرم ڕانەگرین، ئەوا بەزیندوویی نامێننەوە. نێر و مێیەکان بەیەکەوە هەوڵ دەدەن تاوەکو هێلکەکان لەناو هێلانەکاندا کە لە بەرد و ڕووەکە وشکبووەکان دروستیان کردووە بەگەرمی ڕابگرن. بێچووە وردیلەکانمان تا تەمەنیان دەگاتە هەشت هەفتە لەژێر سکی دایکیاندا دەمێننەوە. شوێنەکەیان ئەوەندە گەرم و نەرمە، هەر دەڵێی پێخەفی خەوە.

بێچووە وردیلەکانمان تا تەمەنیان دەگاتە هەشت هەفتە لەژێر سکی دایکیاندا دەمێننەوە. شوێنەکەیان ئەوەندە گەرم و نەرمە، هەر دەڵێی پێخەفی خەوە.






دایکە پەنگوینەکان ماوەیەک دوای هێلکەکردن هێلکەکان دەسپێرنە باوکە پەنگوینەکان، ئینجا خۆشیان بە مەبەستی پەیداکردنی خۆراک بۆ بێچووەکانیان و پاشەکەوت کردنی لە جیقڵدانیاندا، ڕوو دەکەنە دەریا کراوەکان. باوکانەکان بێ ئەوەی لە هێلکەکان جیاببنەوە، چەندین هەفتە ئارام دەگرن و بەبرسێتی دەمێننەوە. جا بۆ ئەوەی هێلکەکان نەکەونە سەر سەهۆڵەکە، هێلکەکان لەسەر قاچیان هەڵدەگرن و بە مووەکانی سکیان دایاندەپۆشن. خۆ ئەگەر کەمێک لێیان جیاببنەوە و هێلکەکان لە سەرمادا بمێننەوە، ئەوا گەشەکردنیان دوادەکەوێت. لەم نێوەندەشدا باوکە پەنگوین بەهۆی نەبوونی خۆراکەوە نیوەی کێشی لەدەست دەدات. پاش چەندین مانگ دایکە پەنگوین بە خۆی و ئەو خۆراکەی لە جیقڵدانیدا کۆی کردووەتەوە دەگەڕێتەوە لانەکەی. ئیدی بە گەڕانەوەی دایە پەنگوین، باوکی ئارامگر بێچووە نازدارەکەیان ڕاسپاردەی هاوسەرەکەی دەکات و بە مەبەستی خواردن و کۆکردنەوەی چەوری، ڕوو لە دەریاکان دەکات.

جا بۆ ئەوەی لەم فیداکارییەی باوکە پەنگوین تێبگەین، ئێستا با تاقیکردنەوەیەک ئەنجام بدەین: هێلکەیەک بخەنە سەر قاچتان و بۆ ماوەیەک بەو شێوەیە ڕاوەستن. ئاگادار بن، نابێت هێلکەکە بکەوێتە سەر زەوی! بێ ئەوەی هیچ بخۆن، تا چەند ڕۆژ دەتوانن هێلکەکە لەسەر قاچتان ڕابگرن؟ لەوانەیە چەند کاتژمێرێک. خۆ ئەگەر حەز دەکەن ناوتان بچێتە کتێبی "گینسەوە"، ئەوا لەوانەیە یەک دوو ڕۆژێک بەرگە بگرن. کەچی باوکە پەنگوین لەو بارودۆخە سەختەدا و بێ ئەوەی هیچ بخوات، بۆماوەی چوار مانگ بەو شێوەیە پارێزگاری لە هێلکەکەی دەکات.


هێلکەیەک بخەنە سەر قاچتان و بۆ ماوەیەک بەو شێوەیە ڕاوەستن.
ئاگادار بن، نابێت هێلکەکە بکەوێتە سەر زەوی! بێ ئەوەی هیچ بخۆن،
تا چەند ڕۆژ دەتوانن هێلکەکە لەسەر قاچتان ڕابگرن؟




کاتێک بێچووەکان تەمەنیان دەگاتە دوو هەفتە، دایکە پەنگوین بۆ دۆزینەوەی خۆراک بەرەو دەریا دەڕوات. لەم کاتەشدا ئەو بێچووانەی بەتەنها دەمێننەوە، لە لایەن کۆمەڵێک لە پەنگوینە پێگەیشتووەکانەوە سەرپەرشتی دەکرێن. ئینجا کە دایە پەنگوین هاتەوە، هەموویان لەدەوری کۆدەبنەوە و ئەو خواردنە دەخۆن کە لە دەریاوە هێناویەتی.



## هەمووومان یەک خێزانین

هاوڕێیان، ئێمەی پەنگوین بە گەورە و بچووکمانەوە (١٨) جۆرین، لەوانە: پەنگوینی ئیمپراتۆر، شا پەنگوین، پەنگوینی شینی بچووک، پەنگوینی چاویلکە لەچاو، پەنگوینی تەپلە لەسەر. ئەو جۆرە پەنگوینانەی لە ناوچە گەرمەکان دەژین، بە بەراورد بە جۆرەکانی تر باڵایان کورتترە. هەریەکەشمان بۆ خۆی خاوەنی کۆمەڵە بەهرەیەکی تایبەتییە کە بەدیهێنەرەکەمان پێی بەخشیوین.



## ڕاوە پەنگوین

ئازیزان، بەهۆی پێکهاتەی جەستەمانەوە، مەحاڵە بتوانین لەدەست مرۆڤ هەڵبێین. نێچیرێکی ئاسانم بۆ مرۆڤ. لە چەند کاتێکی دیاریکراوی ساڵدا، لە لایەن هەندێ مرۆڤەوە بەشێوەیەکی بێشومار و دڕندانە دووچاری ڕاوکردن دەبینەوە. وەکو هەموو زیندەوەرانی تر، منیش ڕۆڵی خۆم هەیە لە پاراستنی هاوسەنگیی ژینگەدا. خۆ ئەگەر بێتو وەچە و ڕەگەزم بکەوێتە مەترسییەوە، ئەوا کاریگەری لەسەر هەموو دنیا دەبێت.



# ژیانی من به ژماره

(١٨) جۆر

ژمارەی جۆرەکانی پەنگوین








(٣٠) ساڵ

درێژترین ماوەی تەمەنی پەنگوین

(٢٨) دەقیقە

درێژترین ماوەی مانەوە لەژێر ئاودا




(٣٦) کم لە سەعاتێکدا

زۆرترین پێوانەی خێرایی لە

دەریادا

(٤٥) کگم

بەرزترین پێوانەی کێشی

گەورەترین جۆری پەنگوین



(١٣٠) سم

درێژترین پێوانەی باڵای

پەنگوین








پەنگوینەکان دەتوانن لەگەڵ زۆرێک لە کەشوهەواکاندا خۆیان بگونجێنن.......

پەنگوینەکان ناتوانن سەیری سەرەوە بکەن. کاتێکیش دەیانەوێت بەم کارە هەستن، دەکەون بە پشتدا...



بەهۆی دزەکردنی نەوتەوە، ساڵانە بە دەیان هەزار پەنگوین گیان لەدەست دەدەن........






بەهۆی گەرم بوونی گۆی
زەوییەوە، بەستەڵەکەکان
دەستیان کردووە بەتوانەوە.
لە دەرەنجامی ئەمەشدا،
پەنگوینەکان کەوتوونەتە
مەترسییەوە...
جیاواز لە باڵندەکان، پەنگوینەکان تەواوی
مووەکانیان لەیەک کاتدا هەڵدەوەرێت.
بەڵام بێ موو نامێننەوە، چونکە لە ماوەیەکی
کەمدا هەمووی پێکەوە دێتەوە......
پەنگوینە نێرەکان وەک دیاری
هاوسەرگیری، بەرد پێشکەشی
مێیەکان دەکەن....



خواتان لەگەڵ هاوڕێیان
یەکتر بینینمان بەتایبەتی لەگەڵ ئەو مرۆڤانەی
لە نیوەگۆی باکووری زەویدا دەژین، زۆر زەحمەتە.
بەڵام هەرچەندێکیش لێتان دوور بین، هێشتا هەر لە
هەمان دنیادا دەژین. بەدیهاتنمان بە جۆرێکە ئەگەری هەڵە
کردنمان نییە. بەڵام هەندێک مرۆڤی چاوبرسی و نابەرپرس،
هەوڵی تێکدانی هاوسەنگیی سروشت دەدەن. بۆیە لەپێناو
پاراستنی جوانیی سروشت، داوامان لە ئێوەی ئازیز ئەوەیە
کە بزانن لەم دنیایەدا ئێمەش ئەرکێکمان پێ سپێرراوە. هەر
شاد و کامەران بن.
خواتان لەگەڵ...




IRFAN PUBLISHING

گوندی ئینگلیزی خانووی ژمارە ٩ / هەولێر

+964 (0) 750 713 80 00

نرخی ٤٠٠٠ دینارە

